# | سەرکەوتن ..

## لە دوای سەبر وبەڵاوەیە ؛

- بە پێنووسی سەرکردەی شەهید أبو إبراهیم مصطفی - ئەمیری جەماعەی سەلەفی بانگەواز وقیتال (الجماعة السلفية للدعوة والقتال) - ڕەحمەتی خوای لێبێ

[ئەم وتارە لە کۆتا نووسینەکانی شێخی شەهید بوو بەر لە چەند ڕۆژێك لە کوژرانییەوە]

هەر چەند چاو لە قورئان وسوننەتی پێغەمبەر بکەین - صلى الله عليه وسلم - وچیرۆك وبەسەرهاتی پەیامبەران وژیاننامەی پیاوچاکان بخوێنینەوە، بە دڵنیاییەوە دەگەینە ئەوەی کە خوای پەروەردگار بێ گومانەوە زەمانەتی سەرخستنی دینی خۆی وکۆمەڵی خۆی ودۆست ویاوەرانی هەڵگرانی ئەو دینەی بە زانست وکردارەوە کردووە، لەولاشەوە هیچ زەمانەتێکی سەرکەوتنی بە باتڵ وگومڕایی نەداوە، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: { كَتَبَ اللَّهُ لَأَغْلِبَنَّ أَنَا وَرُسُلِي ۚ إِنَّ اللَّهَ قَوِيٌّ عَزِيزٌ} - خوا بڕیاریداوە کە: بێگومان هەر خۆم و پێغەمبەرەکانم سەرکەوتوو دەبین، چونکە بەڕاستی هەر خوا خۆی بەهێزو باڵادەستە - هەروەها دەفەرموێت: { إِنَّا لَنَنصُرُ رُسُلَنَا وَالَّذِينَ آمَنُوا فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَيَوْمَ يَقُومُ الْأَشْهَادُ} - ئێمە پەیامبەرانی خۆمان وباوەڕداران لە ژیانی دونیادا سەردەخەین، هەروەها ئەو ڕۆژەش کە شایەتەکان شایەتی دەدەن (فریشتەکان شایەتی بۆ پێغەمبەران دەدەن، پێغەمبەران شایەتی بۆ بانگخوازان دەدەن بانگخوازان شایەتن لەسەر خەڵکی) - هەروەها دەفەرموێت:

**{**وَاللَّهُ وَلِيُّ الْمُؤْمِنِينَ**} - بێگومان خوا یارو یاوەرو پشتگیری ئیماندارانە - ئایەتیش لەو مانایەدا زۆرن ٠**

**هەر وەك پێغەمبەر - صلی الله علیه وسلم - دەفەرموێت:** (لیبلغنّ هذا الأمر ما بلغ اللیل والنهار، ولا یترك الله بیت مدر ولا وبر إلّا أدخله الله هذا الدین، بعز عزیز أو بذل ذلیل، عزّا یعزّ الله به الدین، وذلّا یذل به الكفر) **- شەو ورۆژ بە هەر کوێیەك گەیشتبن؛ ئەم دینەش بەوێ ئەگات، خوای پەروەردگار هیچ ماڵە گوند وشارێك ناهێڵێتەوە ئەم دینەی پێ نەگەینێت، جا بە عیزەتی سەربەرزێك بێ پێی بگا یە بە زەلیلی سەرشۆڕێکەوە، سەربەرزییەك خوای پەروەردگار دینی پێ سەربەرز بکات وزەلیلییەك کوفری پێ سەرشۆڕ ئەکاتن-**

**گومانیش لەوەدا نییە کە نەوەی یەکەمی ئەم دینە بەو سەرکەوتن وعیزەتەوە گەیشتن، واتا نەوەی هاوەڵان وشوێنکەوتوانیان (صەحابە وتابعینەکان)؛ دیاریشە کە جیهانیان فەتح کرد وبوونە گەورەی فارس ورۆم وبەربەر، لەو کاتەی کە جیهان بە زەبر وزەنگەوە لە ژێر دەسەلاتی ئەو دەوڵەتانەدا بوو ٠**

**دواتر ئەوەندەی نەبرد - کە سەرەڕای زۆری ژمارەی موسوڵمانانەوە لەم سەردەمەداو بڵاوبوونیان بە سەرتاسەری جیهانەوە، ئەو عیزەت وسەربەرزییە بوو بە لاوازی وزەلیلی وسەرشۆڕی ٠٠**

**-لە فەلەستین ڕۆژانە موسوڵمانان دەکوژرێن وخوێنیان دەڕژێت، وکۆمەڵێکی کەمی بێ ئەرزشی یەهوود دەستی بەسەردا گرتوون وزەلیلیان دەکەن ٠**

-هەروەها ئەوەی شیوعی وکۆمونیستان بەسەر موسوڵمانانی یوغوسلافیا وشیشانیان هێنا .

-ئەوەی لە ئەفغانستان وعێراقیش لەو خاچپەرستانەوە دەیبینین کە وڵاتیان داگیر کردووەو نامووسی موسوڵمانان ئەتك ئەکەن .

-ئەوەی لە میسرٍ وجەزائیر وعەرەبستاندا لەسەر دەستی حاکمە مورتەددەکان دا ڕوودەدا .

-تەنانەت خەڵکی فلیپین وئەندونیسیا وچین و وڵاتانی تریش لە ئاگری ئەو ئەزیەت وئازارەوە دوور نەبوون، بەڵکو وای لیٚ هاتووە کە هەر موسوڵمانێك دووچاری ئەزیەت وئازار بیٚ مادام کە موسوڵمان وئیماندارە .

کە سەیری ئەو دەقانە دەکەین ولە حاڵی موسوڵمانان دەڕوانین، ئەو پرسیارە گەورەمان دێتەوە پێش؛ ئەویش کە بۆ چی ئەو هەموو شتە بەسەر موسوڵمانان دا دێت ؟! بۆچی خوای پەروەردگار ئێمەی بەسەر دوژمانماندا سەرنەخست ولەم جیهانەدا جێگیری نەکردین ؟! بۆچی موسوڵمانان یەك ناگرن وگوتەو هەڵوێستی خۆیان یەکناخەن ؟! لە کەمیمانە ؟! خۆ زۆریشین ! یا دیارە هۆیەکی تر هەیە ؟ !

ڕاستی یەکەم :

ئەوەیە کە خوای پەروەردگار زەمانەتی سەرخستنی دینەکەی خۆی وکۆمەڵ ویاوەرانی خۆی کردووە، ئەوانەی بە زانست وبە کردارەوە لایەنداری دینەکەی دەکەن ولە ئەستۆی خۆیانی ئەگرن، بەڵام زەمانەتی سەرکەوتنی گومڕایی نەکردووە - تەنانەت ئەگەر هەڵگریشی خۆی بە حەق وبە ڕاست بزانێت - .. ئەوەیە کە عیزەت؛ کە سەربەرزی وبڵندی تەنها بۆ هەڵگرانی ئەو باوەڕەیە کە خوای پەروەردگار پەیامبەرانی لەسەر ڕەوانە کردووەو کتێبی پیٚ ناردووە، ئەو باوەڕەی زانست وناسینەوەیەو کردار وحاڵیشە، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: { وَأَنتُمُ الْأَعْلَوْنَ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ} - هەر ئێوە سەربەرزو سەرفرازو سەرکەوتووترن ئەگەر

ئیمانداری چاك و ڕاست و دروست بن .. بۆیە مرۆڤ هەر چەند بڕوادار بێت وهەڵگری ئەو ئیمانە بێ ئەوەندە سەربەرز وبڵند وبە عیزەت دەبێت، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: { وَلِلَّهِ الْعِزَّةُ وَلِرَسُولِهِ وَلِلْمُؤْمِنِينَ } - عیززەت و دەسەڵات و پایەداری هەر شایستەی خواو پێغەمبەرەکەی و ئیماندارانە - مرۆڤ بای ئەوەندەی عیزەت وسەربەرزی هەیە کە باوەڕدارەو حەقیقەت وماناکانی ئەو باوەڕەی هەڵگرتووە ولە خۆیدا بەرجەستە کردوون، بۆیە هەر وەختێك شتێکی لەو عیزەت وبەرزی وبڵندییە لەدەستدا، دیارە کە ئەوەندیش حەقیقەت ومانای ئیمان وباوەڕی لە دەست چووە، بە ناسین وکرداری دیار وپەنهانەوە.

بە هەمان شێوە بەرگری کردنی پەروەردگار لە مرۆڤ بە پێی ئیمانەکەیەتی، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: { إِنَّ اللَّهَ يُدَافِعُ عَنِ الَّذِينَ آمَنُوا} - خوای پەروەردگار بەرگری لە باوەڕداران دەکات - کە بەرگری پەروەردگاریش لەو مرۆڤە لاواز بۆوە، ئەوە بەرامبەر بە لاواز بوونی بڕوا وئیمانەکەیەتی، بە هەمان شێوە کیفایەت وتێرکردنی ئەو مرۆڤە بە پێی ئاست وئەندازەی ئیمان وبڕواوەیە، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: { يَا أَيُّهَا النَّبِيُّ حَسْبُكَ اللَّهُ وَمَنِ اتَّبَعَكَ مِنَ الْمُؤْمِنِينَ} - ئەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم): تەنها خوا بەسە بۆ خۆت وئەوانەی شوێنت کەوتوون لە ئیمانداران کە پشتگیر و یاریدەدەرتان بێت - خوای پەروەردگار بە قەدەر پەیوەست بوونیان بە ڕێبازی پێغەمبەر وشوێنکەوتنی ئەو پێغەمبەرەوە کیفایەتیان ئەکات، هەر کاتیش ئیمان کەم بۆوە هەموو ئەو شتانەی پێشوو کەم وکورتیان بەسەردا دێت، پەیڕەوی ئەهلی سوننەو جەماعەتیش لەم بابەتەدا ئەوەیە؛ کە ئیمان - واتا بڕوا - زیاد وکەم دەکات.

هەمان شت لایەنداری ویاوەریی خوای پەروەردگار بۆ بەندەی خۆی پەیوەستە بە ئاستی بڕواو ئیمانییەوە، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: { وَاللَّهُ وَلِيُّ الْمُؤْمِنِينَ} - بێگومان خوا یارو یاوەرو پشتگیری ئیماندارانە - هەروەها دەفەرموێت: { اللَّهُ وَلِيُّ الَّذِينَ آمَنُوا } - خوا پشت و

پەنا و خاوەنی ئەو کەسانەیە باوەڕیان هێناوە - سەرخستن وپشتگیری وکۆمەکی تەواویش بە هەمان شێوە بۆ ئەوانەیە کە خاوەن بڕواو ئیمانێکی تەواون، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: { إِنَّا لَنَنصُرُ رُسُلَنَا وَالَّذِينَ آمَنُوا فِي الْحَيَاةِ الدُّنْيَا وَيَوْمَ يَقُومُ الْأَشْهَادُ} - ئێمە پەیامبەرانی خۆمان وباوەڕداران لە ژیانی دونیادا سەردەخەین، هەروەها ئەو ڕۆژەش کە شایەتەکان شایەتی دەدەن (فریشتەکان شایەتی بۆ پێغەمبەران دەدەن، پێغەمبەران شایەتی بۆ بانگخوازان دەدەن بانگخوازان شایەتن لەسەر خەڵکی)، لە شوێنێکی تردا دەفەرموێت: {فَأَيَّدْنَا الَّذِينَ آمَنُوا عَلَىٰ عَدُوِّهِمْ فَأَصْبَحُوا ظَاهِرِينَ} - ئیتر بڕوادارانمان بەسەر دوژمنانیان [سەرخست] وپشتگیریمان لێکردن و[سەرەنجام] ئەو [بڕوادارانە] براوە بوون وسەرکەوتن - بۆیە هەر کەسێك لە بڕواو ئیمانیدا کەم بێنێت؛ بای ئەوەندەش بەشی لە کۆمەك وسەرخستن وسەرفرازی کەم دەبێتەوە .

کە بەندەش تووشی بەڵایەك دەبێت؛ چ لە خۆیدا بێ یا لە ماڵ وسامانیدا، یا بکەوێتە ژێر دەستی دوژمنەکەی ودوژمنەکەی بەسەریدا زاڵ بێ، سەرەنجامەکە سەرەنجامی گوناە وتاوانەکانییەتی، یا ئەوەتا واجب وفەرزێکی فەرامۆش کردووەو یاخود کەوتۆتە نێو کارێکی حەرام وگوناە وتاوانەوە، هەموو ئەوەش لە کەمی ونزم بوونەوەی ئاستی بڕوا وئیمانیەتی.

گومانیش لەوەدا نییە کە حاڵی ئەوڕۆی موسوڵمانان ڕێك بەرجەستەی ئەو ڕاستییەیە، ڕاستییەکە کە ناشاردرێتەوەو ئاشکرا لە بەرچاوان دا دیارە، لە دوور بوونەوەی خەڵك لە شەرع وحوکمەکانی خوای پەروەردگار وپەیامبەرەکەی،و، لە دوورکەوتنەوەیان لە گەڕاندنەوەی کێشەو ململانێکان بۆ قورئان وسوننەت وداوەری کردنیان لە کار وباردا بە ورد وبە درشتەوە، بەڵکو وای لێهاتووە کە گەڕانەوەی مرۆڤ بۆ قورئان وسوننەت وەك کارتێکی لێ بێت، هەر بەرز دەکرێتەوەو واقیعەکە پێچەوانەیەتی، مرۆڤی خۆشبەختیش لە ڕاستیدا ئەو مرۆڤەیە کە سەیری حاڵی خۆی بکات وئەو ڕاستییە بخاتە بەردەم خۆی، پێش ئەوەی بیخاتە بەردەم خەڵکانی ترەوە .. سەیری حاڵ وباری خۆی بکات لەگەڵ

پەروەردگار، لەگەڵ کتێبەکەی، لەگەڵ پەیامبەر وسونـنەتەکەی، لەگەڵ براکانی ولەگەڵ دوژمنانی دا .

بۆیە لێرەوە پێویستمان بەوەیە وردتر لە پرسیاری یەکەممان بڕوانین‌و، لە جیاتی ئەوەی بڵێین؛ بۆ بەسەر دوژمنانمان دا سەرناکەوین وبراوە نابین ؟ بڵێین؛ ئایە ئیمانی پێویستمان بە ناسین وزانست وبە کرداری ئاشکراو پەنهانەوە لە خۆمان وکۆمەڵگە وکۆمەڵ وجەماعەو وسەبازگە ومزگەوتەکانمان دا بەرجەستە کردووە، کە هۆکاری بەدی هاتنی سەرخستنی خوای پەروەردگار وکۆمەکی تەواوی ئەون ؟

لە ژێر تیشکی ئەو ڕاستییەشدا پێویستە وردتر لە زۆرێك دەقدا بڕوانین وهەوڵ بدەین ماناکانیان لە واقیعی خۆماندا بەرجەستەکەین، وەك ئەوەی خوای پەروەردگار دەفەرموێت: {إِنَّ اللَّهَ لَا يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ حَتَّىٰ يُغَيِّرُوا مَا بِأَنفُسِهِمْ } - تا قەومێك حاڵ و وەزعی خۆیان نەگۆڕن خوای [پەروەردگاریش] گۆڕان بەسەر حاڵ و وەزعیاندا ناهێنێت - کە پێویستە هەرکەس بە خۆیەوە دەستپێکات وڕەخنە لە خۆی بگرێت وئیسلاحیکات ودەردەکانی دەوادا .

ئەوەی کە خوای پەروەردگار دەفەرموێت: {**فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ** حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُوا فِي أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا تَسْلِيمًا} - قەسەم بە پەروەردگارت، تا نەتکەنە داوەری [کێشەو ململانێکانیان] وپاشان هیچ لە دڵیاندا نەمێنێتەوە لەو حوکم ولەو قەزاوەتەتو تەواو تەسلیمی نەبن، بڕواو ئیمان نایەنن - هەوڵ دەین لە هەر کێشەو ململانێیەکداو لە هەر پرسێکدا بێتە سەر ڕێمان بگەڕێینەوە بۆ قورئان وسونـنەت وتەواو تەسلیمی ئەو حوکمە بین، ودڵمان ڕەحەت وئارام بێت وحەقەکە قبووڵکەین، بێ ئەوەی بەهەواو ئارەزووی خۆمانەوە پەیوەست بین ودەمارگیری بیر وڕاو ئارەزووی جیاواز بمانگرێت .

ئەوەشی وەك پەروەردگار دەفەرموێت: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لِمَ تَقُولُونَ مَا لَا تَفْعَلُونَ} - ئەی ئەوانەی باوەڕتان هێناوە بۆچی شتێك دەڵێن و ئەنجامی نادەن؟ بۆچی گوفتارتان دژی کردارتانە؟ - وەك دەشفەرموێت: {أَفَحُكْمَ الْجَاهِلِيَّةِ يَبْغُونَ ۚ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ اللَّهِ حُكْمًا لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ} - ئایا ئەوانە حوکم و فەرمانڕەوایی جاهیلیەت و نەفامیان دەوێت و ئەویان لاپەسەندە؟! (ئاخر بۆ بیرناکەنەوە) کێ هەیە بەقەدەر خوا حوکمی جوان و چاك و بەجێ بێت، (بەتایبەت) لای ئەو کەسانەی کە بەوردیی سەرنج دەدەن و ویژدان و هەستی زیندوویان هەیە - هەروەها دەفەرموێت: {أَمْ حَسِبْتُمْ أَن تَدْخُلُوا الْجَنَّةَ وَلَمَّا يَعْلَمِ اللَّهُ الَّذِينَ جَاهَدُوا مِنكُمْ وَيَعْلَمَ الصَّابِرِينَ} - یان واگومانتان دەبرد (هەروا بەئاسانی) دەچنە بەهەشتەوە؟! کە هێشتا خوا (لە جیهانی واقعدا) دەریشی نەخستووە کامتان هەوڵ و کۆشش و جیهادی کردووەو کامتان خۆڕاگرو ئارامگر بووە - هەروەك دەفەرموێت: {فَاسْتَقِمْ كَمَا أُمِرْتَ وَمَن تَابَ مَعَكَ وَلَا تَطْغَوْا ۚ إِنَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ} - ئەی محمد (صلى الله عليه وسلم) کەوابوو چۆن فەرمانت پێدراوە، هەروا بەڕاست و بەرێکی فەرمانەکان بەجێ بهێنە، هەروەها ئەو کەسانەش لەگەڵ تۆدان و گەڕاونەتەوە بۆ لای خواو تەوبەیان کردووە، نەکەن لە سنووری فەرمانی خوا دەربچن، چونکە بەڕاستی ئەو زاتە زۆر بینایە بەو کردەوانەی کە دەیکەن. - هەروەها دەفەرموێت: { وَلَوْ أَنَّ أَهْلَ الْقُرَىٰ آمَنُوا وَاتَّقَوْا لَفَتَحْنَا عَلَيْهِم بَرَكَاتٍ مِّنَ السَّمَاءِ وَالْأَرْضِ وَلَٰكِن كَذَّبُوا فَأَخَذْنَاهُم بِمَا كَانُوا يَكْسِبُونَ } - خۆ ئەگەر خەڵکی شارەکان بەڕاستی باوەڕیان بهێنایەو خۆیان بپاراستایە، ئەوا بێگومان ئێمە دەرگای فەرو بەرەکەتی ئاسمان و زەویان لەسەر دەکردنەوە، بەڵام ئەوان کە پەیام و پێغەمبەرانی ئێمەیان بەدرۆزانی، جا ئێمەش بەهۆی ئەو کاروکردەوانەی کە دەیانکرد گرتمانن و لەناومان بردن - هەروەها دەفەرموێت: { وَمَا كَانَ رَبُّكَ لِيُهْلِكَ الْقُرَىٰ بِظُلْمٍ وَأَهْلُهَا مُصْلِحُونَ } - پەروەردگارت بە ستەم خەڵکی شارو دێهاتەکان لەناو نابات، لەکاتێکدا خەڵکەکەی چاکەخواز و چاکساز بن .

## ڕاستی دووەم:

ئەوەیە کە ئەگەر لە خۆمان ولە کۆمەڵگەو لە هەموو حاڵ وبارێکماندا ڕاستەڕێ بووین ورێبازی ڕاستەڕێمان بەرجەستە کرد، ئەبێ دەرك بە ڕاستی دووەمیش بکەین، کە هەر بانگەوازێکی حەقی سەر پەیڕەو وپرۆگرام ومەنهەجی پەیامبەران، بێ گومان هەڵگرانیشی تووشی بەڵاو وتاقیکردنەوەو موسیبەت وناخۆشی دەبن .

بۆیە خەڵکانێکی زۆر بە سەبەبی لاواز بوون وزەعفی ئیمان وبڕوایانەوە، یاخود لە دەرك نەکردنیان بە حەقیقەتی ئەو دینەوە، کاتێك کە موسیبەت وبەڵای موسوڵمانان دەبینن وگەمارۆی دوژمنانیان لە یەهوود ومەسیحی ومەجووس ومورتەددانیان دێتە بەرچاو، کاتێك کە پشتلێکردنی دوور ونزیکیان ئەبینن؛ تەنانەت نزیکترین خەڵك کە تا دوێنێ بانگخواز وسەرڕاست بوون .

کاتێك کە ئەوە دەبینن؛ وا ئەزانن بانگەوازەکەیان نادروستەو، ئەو بەڵاو ئازار وناخۆشییە سزای خودایەو دیارە کە حەق شتێکی تری غەیری ئەوە، خوای پەروەردگار دەفەرموێت: {آلم أَحَسِبَ النَّاسُ أَن يُتْرَكُوا أَن يَقُولُوا آمَنَّا **وَهُمْ لَا يُفْتَنُونَ** وَلَقَدْ فَتَنَّا الَّذِينَ مِن قَبْلِهِمْ **فَلَيَعْلَمَنَّ اللَّهُ الَّذِينَ** صَدَقُوا وَلَيَعْلَمَنَّ الْكَاذِبِينَ} **- الم، ئایا خەڵکی وایانزانیوە**، وازیان لێدەهێنرێت و پشتگوێ دەخرێن کە بڵێن ئیمان و باوەڕمان هێناوە، لەکاتێکدا ئەوان تاقی نەکرێنەوە و تووشی سزا و ئازار نەکرێن؟ سوێند بەخوا بێگومان ئێمە ئەوانەی پێش ئەمانمان تاقیکردۆتەوە بە جۆرەها شێوە، تا خوای گەورە (لە جیهانی واقیعدا) ئەوانەی ڕاستیان کردووە بیانناسێت و دەرکەون، هەروەها درۆزنەکانیش دەبێت بناسێت و دەرکەون .

أبو هريرة لە پێغەمبەرەوە دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دەفەرموێت: (من يرد الله به خيراً يصب منه) - هەر کەس خوای پەروەردگار خێری بۆ بوێت، سزای [لە دونیادا] لێ وەردەگرێتەوە .

[ئیمامی بوخاری ومالیك روایەتیان کردووە]

ئیمامی شافیعی پیاوێك لێی پرسی ڕەحمەتی خوای لێبێت: (باوکی عبد الله ! کامە باشترە؛ پیاو جێنشین کرێت، یاخود تووشی بەڵاو موسیبەت بێت وتاقی بکرێتەوە ؟)، ئیمامی شافیعی فەرمووی: (تا تاقی نەکرێتەوە جێنشین ناکرێ).

خوای پەروەردگار نوح وئیبراهیم وموسا وعیسا ومحمدی تووشی بەڵاو موسیبەت کرد وتاقی کردنەوە - درووود وسڵاوی خوایان لێبێ - ئینجا کە سەبریان گرت وجێگیر بوون خوای پەروەردگار جێنشینی کردن، بۆیە کەس وا نەزانێ تەواو لە ئێش وئازارەوە ڕزگاری دەبێت، کە پێویستە بزانین سەرکەوتن وجێنشین بوون وتەمکین بێ بەڵاو موسیبەت وتاقی کردنەوە نایەت، ئەوە پەیامبەرانی خوای پەروەردگار بوون کە لەخواترستر ودەستپاکتر ونزیکترین خەڵك بوون لە خوای پەروەردگار، تووشی ئازار وناخۆشی وتاقیکردنەوەو بەلا بوون، بەڵکو بڕێکیان - وەك زەکەریا ویەحیا سەلامی خوایان لێبێ - کوژران وهەندێکیان لە نێو ماڵ وحاڵیانەوە دەرکران، بڕێکی تریان لێیان ئەدرا وئازاریان ئەکێشا، هەر کەسێکیش هاوشێوەیان بێت ولەسەر ڕێڕەو وڕێبازی ئەواندا ڕێبکات بەو ئەندازەوە تووشی بەڵاو موسیبەت وناخۆشییەکانی ئەوان ئەبێت .

شوێنکەوتوانی پەیامبەرانیش توندترین ئێش وئازاریان دەکێشا، خەبابی کوڕی ئەرەت دەفەرموێ: ڕۆژێکیان پەیامبەر لە ژێر سێبەری کەعبەدا لەسەر عەبایەك دانیشتبوو، چووینە لای وسکاڵامان بۆ بردەوەو دەردە دڵیمان لا کرد وگوتمان: (داوا ناکەیت خوای پەروەردگار سەرمانخا، بۆمان ناپاڕێیتەوە ؟)، فەرمووی: (ئەوانی پێش خۆتان پیاویان ئەبرد قۆرتێکیان

لە زەویدا بۆ ئەکەند وئەخرایە نێو ئەو قۆرتەوە، ئینجا منشاریان دەهێناو ئەیانخستە سەر سەرییەوەو ئەیانکرد بە دوو لەتەوە، بە ئاسن تا سەر گۆشت وئێسکیان هەڵدەقەنی، وای لێ نەدەکرد لە دینەکەی پاشگەز بێتەوە، قەسەم بە خوا، خوای پەروەردگار ئەم [بانگەواز ودینە] بێ گومان بە سەرەنجامی خۆی دەگەینێ، تا وای لێ دێ کابرای سوار لە سەنعاوە تا حضرموت [کە دوو شاری یەمەنن] سەفەر ئەکا، تەنها لە خودا ولە گورگ ئەترسێ نەوەك مەڕەکانی بخوا، بەڵام ئێوە پێش قەدەمی دەکەن وپەلەتانە) ئیمامی بوخاری روایەتی کردووە .

بە گشتی؛ پێویستە هەر موسوڵمانێك لەوە حاڵی بێ کە ڕێگەی حەق پڕیەتی لە ناخۆشی وئێش وئازار وبە درِك ودالَّەوە داپۆشراوەو، وێستگەو دەروازەکانی؛ زیندان ومۆڵگەی ئەشکەنجەو ئازارن، وخۆشی ولەزەتەکەی؛ نۆشینی سەبرە لەسەر ئەو ترس وبرسێتی ولەدەستدانی خۆشەویستان وبرین وخوێنەی ڕێگەی خوای پەروەردگار، ئەم تۆوە پیرۆزەی دەشمانەوێ لە هەموو بستێکدا بیچنین - کە تۆوی ئیسلامە - هەر بە خوێن ئاو ئەدرێت وبە لاشەی پیاوان ولەتکەی جەستەیان گەورە دەبێ، ئەو جەستانەی بە بۆمب وفیشەکەوە لەت لەت ئەبن، نەك سەمادە دەستکردەکان .

ئەمەش ڕێگەی پەیامبەرانە، ڕێگەی پەیامبەرمان درووود وسڵاوی خوای لێبێت کە ددانەکانی لە شەڕدا شکان وخوێنی ڕژایە سەر دەموچاوی پاکی وئەو پەڕی ئەزیەت وئازاری کێشا، تا ئەو کاتەی دینەکەی تەواو وکامڵ بوو وپاك وسەلامەت بە ئێمە گەیشت، هەر واش دەمێنێتەوە تا ڕۆژی دوایی .

خوای پەروەردگار دەفەرموێت: { وَجَعَلْنَا مِنْهُمْ أَئِمَّةً **يَهْدُونَ بِأَمْرِنَا لَمَّا صَبَرُوا**ۖ وَكَانُوا بِآيَاتِنَا يُوقِنُونَ } - کاتێك کە سەبریان گرت وئارام بوون ولە ئایەتەکانمان دڵنیا بوون، ئەو کات کردمانە

پێشەنگ وپێشەوای [خەڵك]، کە بە ئەمر وفەرمانەکانی ئێمەوە خەڵکیان هیدایەت ئەدا ورێنموونییان دەکردن .

شيخ الإسلام ابن تيمية دەڵێت: (بالصبر واليقين تُنال الإمامة في الدين) - ئیمامەت وپێشەوایەتی لە دین دا بە سەبر وبە دڵنیایی [لە دین وئەمر وحوکمەکانی خوای پەروەردگارەوە] بە دەست دەهێنرێت .

لە سوفیانی کوڕی عویەینەوە دەگێڕنەوە کە تەفسیری ئەم ئایەتەی دەکرد ودەیفەرموو: (کاتێك کە سەری ئەو [دین وفەرمانەیان] هەڵگرت، ئێمەش کردمانن سەر وگەورەی ئەو خەڵکە) .

لە گۆڤاری "جەماعە"وە

گۆڤارێکی دەوری جەماعەی سەلەفی بانگەواز وقیتالە (ڕێکخراوی قاعیدەی مەغریبی ئیسلامی ئێستا)

ژمارەی دووەم، ذو القعدة ١٤٢٥ کۆچی



**پێگەی ئیسلامی گزنگ**

Facebook:- @Gizing.net

Telegram:- @GizingNet

٢٠١٦ - ١٤٣٨